dilấm dälếî bạḥri wấna,
läñgấrîân tê bärdấn gämlä wấna.

jûấbê bénêrin bô bâläkấn,
sûấr bín lä kû̃ät û halashấn,
lä bô säfấî kizh cấû-räshấn.

kûästânấn lämín dâghấn dâghấn,
sûrgúl pishkût lä cûấr bâghấn. —

kấkä zến û bérâlä zến û kizhä rêḥânấ!
âwírêkim bấr bûªtäwä lä därûnê;
nä bä bấê däkuzhiếtäwä nä bä bârấnê,
nä bä pấc û pêmärấn, nä bä gil-pîâ-dấnê,
nä bä shếkh astûr kirêwấ, nä bä cấkä sûấrî tâzhấnê,
nä bä sêid äḥmâd sâwấnê,
nä bä tîpî sûârấnî dấshtî kấû lä ḥärîrê,
nä bä guläñgấ û qôitâsấî kấrî mûsîlê.

رجای نذرم بحق
لسر زینیم نکن شق
بغدایم پی نکن لق
شای که او قصی پی دزانی
هلدستنا بو سر چوکنی
هر دوگ دستی دان لرانی
پاشای دگل سلیم خانی
دینیرموه کردستانی
له کردستانی ب خیوی
له بغدایه سر ببزیوی
ایران و طوران بشیوی
هر چه لیو دابنه لسر لیوی
نرم دکم وکو میوی
دری داویم لو نیوی
دری داویم به عجمان
به افشار و مغدمان
پیدا بو صدای زمزمان
لبر دنگ زیل و بمان
شیر هلاتن له ثوی چمان
نهنگ د بحران دا نمان
شا خوش بی نکیشی خمان
راهی ببی چه قصه نمان
راهی بی دگل الیه
لیره بروا تا بغدایه

پاشا سوار بو بو موطنی
معطل له ثوی کرثەدنی
ھەت ثیه قرەحسنی
اصح یغیه پی دکنی
له پی‌کنین سردار
چرەچرە کوچ و بار
ھەلثیرا ریه ریبوار
له جحیل تا ھرزەکار
ھر له پیر تا اختیار
ھر چه دستی بگری دار
دنیا دبو شو تار
خوین لسام سوران بار
خوین باری لسام سور
ھر له نیزیک ھر تا دور

پاشای ببەن قران قران
بو به سر سرعسکران
سوندی خوارد به پیغمبران
لبو شای دنیرم سران
سر اوغان و قجران
سرکسرک بو لموندران
قاصد ھاتوه بمطلق
قصی کردن دقودق
وزیره وک برد رق
او خینی مستحق

واى كوتوه شعرى شيرى
ياالله پاشاى ڤويم بديرى
كه فرصت هات قط نىبوبرى
مرد هر خوى به الله دسپيرى
هر اللهيه صاحبسوره
و دست كوت به بىقره
پشتيان شكان زڤى درا
لسيه تو ريشى برا
ليك سوار بون كره‌كره
لردو اردوان بو بچره
بو بچره و صلاوات
قوهقوه هاتههت
هر خيوتن بى قلات
هى دستى بى دسلات
دوى ڤيران كى هلات
لوان كوى ده بدبخت
خلاص ناكن روحى سخت
كلپور و مل نقد
اسپ و ايستر ريشمه و رخت
ورڤيرا نقد بنقد
ورڤيرا بقطروه
به الطون و ديناروه
به اغا و خذمتكاروه
پاشاى بخشين به باروه
چى پى بخشين پى بون غنى

خذمت نەکم واللە
آفرین بارکاللە
توکل تعالی‌اللە
هە کرە بەبینە هللە
بەبە هتن بە لی‌مشت
لغیرتیان بست پشت
دستی لە بغدایە ششت
حمد پاشای کوی کشت
کشتنی بە چە قرار بو
پشای بەبان سردار بو
صد وک وی خذمت‌کار بو
دحلی خوی دا شوفار بو
خذمتی پاشای پی عار بو
بی‌طلعی لە ملان بار بو
طالع پاشای دیار بو
پاشا کردیە گفتگوی
دگل تو محمد کوی
حزم کرد هتنی و نروی
زورم حز کرد میر سوران
دوزمنی وکو گوران
بعقل هتویە نوران
بی‌کسی دژمنی زوران
او جار لی دن بساطوران
ساطور دبان رنگڤ شمشیری
دست و بهو حملە شیری

خلق کل شیانی
مالک بحر و بریانی
عالم و خبیر هموانی
توفیق‌در مستعانی
ازم علی بردشانی
دبندیم نکی زبانی
بیتی دلیم بدیوانی
مدح پاشای کردستانی
مدح پاشای کمیان باشه
شاید روم و قزلباشه
هر جاری شیری دکیشا
هموی دهاتنه تماشا
عالم الایه چاوشه
مرده عبدالرحمان پاشا
پاشای ببان جهانگیری
وك روستم زال پیری
طحا برا و تگبیری
را نەبویری به رنیلی
نکم خذمت وزیری
نانی دستبنم به شیری
به شیر نبی قط پیك نیبی
دولت نیبنه ردایه
ناچمه سفر لحمایه
یاغی دبم له بغدایه
یاغی دبم انشاالله

## XVI.

### بیت عبدالرحمان پاش بەبە

خالق هر اتوی قادر
ربی هر اتوی قادر
چند باقی و هم نادر
توی ارض و آسمان راثر
هشتی هزار عالمە بیشکە واللە زیاتر
امنیش یکم لوان عالمان خو دڭرم لێموان کمتر
سجدە شکریم لسر بو نت‌خلقاندم بکافر
لا اللە الی اللە صد هزار جار شکر
توی اول و توی آخر
توی باطن و توی ظاهر
چند باران و چند بفر
چند روبار و چند بحر
چند آسمان و چند هور
چند بهشت و چند آور
چند قوشن و چند لشکر
چی تو پیبت بەبی امر
نش‌بیتن دکی حاضر
حاضر دکی بروانی
ربی هر توی تن سبحانی

قسی خانیان قبول کرد
بحوتوبکی پاکی وه خر کرد
به سابلاغی تخبیر کرد
ثویو لمن بی ثلی جماعتی
کس به بگزادان هلنخلتی

بو خوم دبمه جی‌نشین
دلیم بیگ‌زاده چه نین
اگر او قصه هنت رابرد
خنی رونیشت تگبیری کرد
قسی خویان پاک یک کرد
عرض پادشایان دکرد
پادشا لوانی قبول کرد
بداخان گرد و خرد
مانگیکی دی صبر کرد
پاک منگر وه خر کرد
سر تا پای خلات دکرد
بداخان کتی بمبنم
باپیر امنت دست‌بینم
سابلاغیت بو دستینم
باپیر مبه انتظار
دبی بدبیه حاکم شار
لبرم هیه یک کار
کارم هیه لویندری
جاری دنیرم چپری
چپریک بروان
بو کن پادشی بدلو جان
مراغی بکم ویران
پادشای دکم بی‌خدان
بو خوت به به اقای هموان
له منگری گرد و مرد

خذمت خانیان نکرد
بوی بدیان بو رابرد
خان عرض شای لوان کرد
بوییان تکبیر لی کرد
خان کتی خذمت بکرمینیان کرد
بوبی پاک برد قری کرد
قری کرت لزمانی
بنورنه تکبیر خنی
وای کذران دزانی
امین دولتنی
بلباس زور بستزمانی
خذمتو نکرد بخانی
بو خو پیدا کرد غیانی
طایفه بداخ سلطنی
نه کن پادشای روانی
منکر زور بستزمانی
بستزمنی بی شمار
نەیاندا خرج و بیکار
خانیان لی بو دعوا دار
هاتنه پیشی پیاده و سوار
مالیات نادین چه جار
وای کوت باپیر نزدار
بو خوم دبمه حاکم شار
خانی در دکم او جار
خانی در دەکم یقین

میرە روژی تنڭتە
بری هلندا ڭورانە
ملا رسول بی فرە
دە پیش بداغی ڭراه
خانە بسی بی او شرە
اسلام هموی ورڭراه
اسلام پاك ورڭراوە
هتا سیلمی هلناوە
تا سیلمو بیطاسی
اخسیر بە سی عباسی
بە سی عباسی اخسیر
زینی رومیان بارڭیر
لە سری بو رمب و شبیر
بداخانە جهانڭیر
بداخان بو لدوای
هزار مر شوڭای
هر هرزانە خورای
دەیاردا مر و شاهی
بزنیك بینی دو کرە
لموی بکری دوارە
بهای بزنیم دو پارە
هزار ڭا بی جوتبندە
قیمت ڭای خلابندە
بلباسان کاریان ڭندە
لە بلباسی ڭرد و مرد

بوچ بدینی غیانه
وای کرد بو عجمانه
پی‌یان نکا مسلمانه
غلیظن او سگانه
نمره او بداخانه
ناترسی له گورخانه
چیان کردبو بسته‌زمانه
مله خوی کرد ویرانه
کسی ندیشت له عیلانه
ربی صد جار شکرانه
چونکه پیش‌کاری شیطانه
دست هلگری لو کارانه
هات و گیه کاریزی
مندالی پر به آمیزی
اخسیر چونه توریزی
هات و گیه دریازی
محبوبیان بژارد لرازی
هته خوار له لاچینی
لت بی له نیوی زینی
له بلباسی به قینی
برایم اقا بی لسر دا
تاقه سواری بی گردا
خیزانی دیکه‌دی وردا
دیکه‌دی وردا خیزانه
حسن بکر اقانه

كر له سر سنگی ببی
لی‌یان دا بجلابی
تو قط مسلمان نابی
صبحینی علی السحر
کویت و بوز و صقر
له خاوی‌یان هینه در
لی کن زین مختبر
تندی بکیشن تنگه و بر
پی نا لرکیف کتوه سر
سوار بدبی په‌پاغ بسر
په‌پاغ بسر سوار بی
خیل فقیر هزار بی
مکری هر وا داغدار بی
هر هاوار و لی‌دان بی
هر هاوار و لی‌دانه
بی سردار و خیزانه
دهلی مری بی شوانه
پاجش بون لزویانه
دولابی بخزادانه
سرکردی مکریانه
خراب بون او کدانه
بفری دان مسلمانه
یکیان نمان اوانه
همید بداخ سلطانه
قبول نکا لوانه

وک بژانگ ده داران
سریان گیه حصاران
له حصار ده وا گرد
له بلباس ده وا خورد
لش و کلش بوں به پرد
عجم بسر دا رابرد

هر کسه میوان خوی کشت به دهول و زرنا هاتنه سر باپیر
اقای جا باپیر اقا له بداخان پرسی

له باپیر اقای جندیه
له بداخانی پرسیه
خان او قولمقوله چیه
دلی باپیر شوگییه
اوه دهول و زرنه و شاییه
اوه پیشه ترکیه
ذوقه لبو خلقیه
روزیک له روژاوایه
خان باپیر له سرایه
آور توپخانیان دایه
ذلیل باپیر اقایه
لیری هیچ بو پیک نایه
خدر شوریان هلناوه
له پیش بابی راکیراوه
حمه سور به چلنگی
وک شمامی حوت رنگی
هلیان اشکاوته سنگی

لو لای بی شبرە خرە
توپیان لی دا بگرە
حوتی لی بون بورە
دنگی لە ارضی برا
آفرین وستای خراط
دست بە خنجری دەدات
حوت مالی کرد بر باد
وستا عذیر هندو
خنجر شام و تشو
لە بر گرکی دا چو
یکی لی خلاص نبو
هوی وستا عذیری
حوت مال بوجاغ کوری
هر یکیکیان دەبوری
آوتی جزایری
دا بوی لە تپل سری
اویشی کرد بی بری
کوا مرزنک کوا اومربل
شورە لاوی شل و مل
لە کولانان بونە جل
بونە جل لە کولانان
لشی دە وان نوجوانان
کوتبون لە کولانان
لە کولانان و کناران
لشی دە شورە سواران

خالق توی فریادرسه
مرگ بهروزه
بداخان لی بو قضا
ریکی دهدان بخزا
طایفه خان باپیری
ریکی دهدان بشبیری
بو به خانهبگیری
اسلام قر بو به شیری
به شیری قر بو اسلام
تیان دا بو قتل و عام
قتل و عامیان تیدا بو
سلیمان بخو و به بران بو
سلیمان بخو به برانه
در دچو له دربانه
اگر لدربان. در چو
چوار و پنج کوته دو
خلاص بونی بو نبو
بوی نبو خلاص بونه
لو کافر ده ملعونه
بو رمب ده سیسونه
به داسی کرنتوه
هر وکه گنمان دهدرونه
هر وکه گنم سواله
ده خوینیدا شلاله
بلباس حالت بیحاله

عجم يكجار هلاكه
عجم هلاكو زور زانه
چو سر خانى برمبانه
دلى ببه لى‌دم امانه
بانگم و بر پادشاى لژور
خانى ناردنى دور به دور
بلباس هاتن به جمبور
رانك رشى چكمه سور
خانى ناردنى به حاجنه
بلباسان طالحا و بخته
بسى رختنى د زرده
كاكه رشى نامرده
هاته خوارى لسردا
ايمانى پى بو هردا
منگر ده رمب جولانه
چاوبان كوت به زيرانه
و ژور كوتن يكانه
چند شيو پر درمنه
چندى شيشه و شرابه
عجم بون به جلابه
مكرى بون به قصابه
هيچ كسى وا لى در نابا
چلون دبى او حسابه
هموى مست شرابه
وا لى در نابا كسه

له بو مراغبین بری
بو مراغی برده خوار
یا بینای پروردگار
بزار خوشه نهصد سوار
هم رحمبر و جبار
ایزرائیل بو جلودار
بو مراغی برده خوار
بو مراغه راکشان
ورشهورشی کمبران
بین مشک و عنبران
فندی پهپاغ بسران
قتن نابی گذران
قت نان‌بی گذرانه
عجم زور بی ایمانه
لی‌ن تیکڤ ده‌دن مکانه
سرن دبرن لبرانه
خدر اقای نوجوانه
چو سر خانی برمبانه
بابه لی‌دم امانه
باپیر دلیتن کاکه
کس اوی مصلحتی ناکا
بداغم دڤل پاکه
هیچ دعوین لی نکا
تگبیران به‌کین چاکه
جیگاکن زور غمناکه

رایان کرده جلیتانه
مصلحت هموانه
بی‌چین بو سر عجمانه
رابرن بداقخانه
مراغی بکین ویرانه
بی‌ین رونشین لیرانه
مدبر کاک سلیمانه
چونکه گوری عیلانه
چه ده‌فرموی کیانه
ایره دبی ویرانه
مارهیان بکین ژنانه
ایدی چلونه سوزی‌خانه
هوی سلیمان خزالی
نوی رستم زالی
حوت قبی له متالی
پیم نه‌لین تو مندالی
له جلیتی نکرد خالی
وک هوران بگوالی
دکژین مالو طفالی
درنگه ری مکن خالی
کیه الله اکبری
لینگی دا پیش خانی به مشتری
دلیم خانه اتو کوندری
نه‌صد سوار بدفتری
دلیم خانه لرحیم بویه مشتری

دڨل خان سابلاغی
سیری کیف و دماغی
چو له عجمی باغی
باپیر اقای خال لرو
بروژ سی‌شمو چو
عام خلقی چاو لدو
چاویان لی کرد بفندی
هات ڨیه وکیل‌کندی
حوت‌صد سواره لرندی
صبحینی چیشت هنڨاوه
قاصدیان دڨراوه
چی ماوه دنڨیان داوه
قوشن نبوه تواوه
تڨبیریان لی روناوه
صبحی بیانی داوه
هر بزوت نوسی‌راوه
دو عاشیرتی ماوه
اغلب رمب نظریه
یک له صنتی کم نیه
بزانین مصلحت چیه
بی تیپ مرنه‌کەنان
بو عقلم راچنان
بعقلم راچنانه
مقصودیان ڨورانه
سلیمان به خو به برانه

بو مراغی روانه
سی‌شم سر هموانه
بسی‌شمو پر هنر
باپیر اقای پر جگر
بداقخان بو دستبر
له سابلاغی چو بو در
دلی هیچ پرچت ناینه بر
خلق صاحب‌صفایه
پرچ دوی دنیایه
بامید او خلایه
لیان دا دهول و زرنیه
اسپیان هاته سمایه
زور خوشن بو دعوایه
همید رسول اللهیه
او کاره وا پکن نایه
هات ئیه ققرقایه
لیان دا دهول و زرنیه
حوت‌صد کسی راثیرایه
ذوق باپیر اقایه
لیدن له دپل شایه
شدر و بر خلایه
مکثن صید و ملایه
قرعانیان د سنگی دایه
هت ئیه خاتون‌باغی
باپیر اقای قوچاغی

XV.

بیت باپیر اغای منڭور بابی حمزه اغا

ڭوی رادیرنی دیوانه
ڭوی لمن بی دیوانه
سه شو و سه روژانه
بوو بکم مدح شیرانه
دولاب مکریانه
کاغذ چو بو عیلانه
بی رشی رسول اقانه
دڭل حمد شینانه
رابریان آ رحمانه
چولیان کرد باژدانه
بعزت سبحانی
صبحی دڭل بیانی
لشکر باپیر خانی
رنڭ وزیر رومیانی
سوار بو لباژدانی
منڭر ده میوجغی
پیاو بون لسابلاغی
تدارک بو مراغی

دکم زنبیلفروش کتنی قربان ویستنا که میردم پی ناکا اتو او باغت به من کرم فرموه فعلم بدیه بو خوم دچم خنویکی لی درس دکم ننکَ فعلانیان بو دا هر کس بخیر بوی چو اوی روژی قلایان بو درست کرد نیویان سواغ دا دره‌وییان سواغ دا زنبیلفروش چو تیوی سر بره سر سجده دعای کرد کتنی یا ربی امن و خاتون بینبوه سرحد چارده سالیه جی به جی هاتنوه سرحد چارده سالیه خاتون او جار خوی لی ماره کرد پیکوه دانیشتن

دستیک گُل به نادری
صاحب المانی نمری
اوه فرمایش رحمن بکری

امین‌دار جی به جی زنبیل‌فروشی گرت
مزگینی‌یان بو خاتون دبرد
خاتون چراغانی دکرد
والله له دلم هلگیرا غم
جا خبری به پادشای بدم
او جارکه مردی دکم

کاغذیکه بو برای نوسی کوتی قایل بی مردی دکم ناقایل بی هر دکم پادشا کاغذکی ماچ کرد خوندیوه کوتی لمن دولت بشارته اگر مردی بکا پادشا فرموی حز دکم اوی او مردی پی دکا بزانم کیه خاتون کوتی اگر دفرموی دینیرمه خذمتی خاتون کتی هستنه بچو سلاوی بکه تعظیم مکه که زنبیل‌فروش هلستا چو سلاوی له دیوانی کرد پادشا کتی او فقیره کیه شتیکی بدنی بروا کتیان قربان اوی خشکی توی دوی اویه کتی بابم خشکی من مردی به تو دکا کوتی بلی اگر خلا بدا پادشا رقی هلستا اوی له دیوانی بون کس قسی پی نکرا پادشا کتی خشکم بکوژم یا اوی بکوژم کتیان قربان هیچیان مکوژه درکی خوت بخون مکه او سال دوازده ساله او باغه هژدیهایک تی‌دایه هر چی بچیننه او باغی هژدیها دی‌خوا اوی بدنیره بخوری پیاویکیان دگل نارد هژدیها بی‌خوا کا برا کتی چونکه خاتون پادشای اتوی دوی اتوی ناردوه هژدیها بت‌خوا امن ناویرم بیم کوتی بابم اتو راوسته زنبیل‌فروش روی او هژدیهایه بو به پیاو به پیر زنبیل‌فروشی‌وه هات کوتی یا ربی زور شکر اوه خوت و باغ خوت اوه رویم کا برا که مزگینی بردوه بو پادشای کتی اوانه مسلمانن پادشا هلستا بو خوی روی خلق او شاری پی‌یان مسلمان بون قولی زنبیل‌فروشی گرت بردیه دیوانی کاغذیکی بو خشکی نارد لمنی کوی بو میردی دیویتوه ادن بدا مازی بکم کتی حاشا میردی پی

زنبیلفروش دلی خاتون ئیانه
اگر قایلی بو هوی‌ساریانه
دچم اویش دینمه ایره‌کانه
لی بو له زنبیلفروشی گلباوه
اگر چو نگراوه دواوه
لو شاریش چو بو لاوه
خاتون لوی باجی ماوه
روژ بو نیبوه‌رویه ور گراوه
خاتون گوتی چم لی قوماوه
بوچ قاصیدیک نه هات واوه
خلایه لاخوم سر بنالی
انجا چو لون بگموه مالی
لی بو له زنبیلفروشی خورد
روی ده شاریک دیکه کرد
حوت سالی دی کسبی کرد
خلا وای کرد ژنکی مرد
حوت سالانی تازیه دا گرت
روی ده شاریکی دیکه کرد
سی سالی زنبیلفروشی کرد
خاتون قلای درس کرد
صورت هر سیکانی درس کرد
خاتون زور خاموشی
صورتیکی خوی درس کرد
یک ژنی یکی زنبیلفروشی
اگر او صورتانی درس کرد

بوت هلیگرد پی دا نارده‌وه بو خوشی هلستا چو بزاری ننی کری پنیری کری زوری برسی بو تمای بو نانی بخوا کوتی خلا لیم هلناڤری او ژنه چاوی لدستی منه هتوه مالی ژنی زنبیلفروشی زیرکنی برده‌وه ختون کتی اوه کم بو بویت هینده‌وه کوتی قربون بو چی میردی من نتوانی له بیابانان اوانه بینیتوه روژ هتبو اوابونی ختون کتی وره نقل خوتمان بو بگیروه با من امشو له جیاتی تو بچمه بال زنبیلفروشی ژن زنبیلفروشی عمو ری و شوینی زنبیلفروشی پی گوت ختون خوی روت کرده‌وه جلی خوی دا بژنی زنبیلفروشی ژنی زنبیلفروشی جلی وی دبر نکرد ختون جلی وی دبر کرد چو بو مالی زنبیلفروشی اڤر و ژور کوت زنبیلفروش کتی عمره‌کم بوچوا درنگ هتیوه کوتی ختون رای گرتبوم نیدیشت بیموه کوتی وره نی بخوین ختون لخوشیان نی پی ندخرا کوتی زو جیم بو چ بکه دنوم پیکوه چون د جیوه اڤر هتن راکشان ختون باسکیکی بو کرده سرین اوی دیکشی له استوی کرد ختون زنبیلفروشی ماچ کرد زنبیلفروش کتی دا خلا له کنگیوه کیف لیه بوی اورو او نصیبتدام بسر هات زنبیلفروش لاقی هلینا ختون لفکر نبو خرخلی زیر له پی درنی دستی وی کوت کوتی خنمخراب اوه ژنی منیان سوند داوه خوی لی گوریوم لاقی دان و هلستا و در کوت ختون چو بیگری هلات ختون ری کوت دیگوت انشاللّه له کوچی دیگرم زنبیلفروش دیگوت انشاالله امنیش لو کوچی لی ون دبم هتا بیبنی ری کوت بوی نگیرا زنبیلفروش اوری داوه هر لدوی بو ملی له چولی نا شاری بجی هیشت له چنگنی عراسان بو ده ارضی را خری ارض قلشتوه چو نیوه ختون میری گیه لسر ارضی غلامنی تند گرت هر چند هاوار دد بری ندا کوتی والله نیه دری قسانم دڤل نکی برت ندم

خاتون میری کوتی لاو بو نەهاتوه خوار چو سر بانی تماشای کرد زنبیلفروش دڵل قرەواشی نیە پرسی چی لی هات کوتی خاتون لسر را خوی هلداشتە کوچی خاتون کوتی جا امن چبکم غموە جاریکی دی چاوم پی ناکوی روانی بکوچیدا هل دەهات اگر تماشای کرد زنبیلفروش چو دخانیویکیوە خاتون میری نشانی کرد ژن زنبیلفروش کوتی ها عمرەکم بوچ وا بزرکاوی ادی نانت بو نەهیناوە کوتی امرو زنبیلم بردنە مالی میری بردیانە ژوری حقیان بو نە هینام امنیش هاتموە ژنکی کوتی دەنا زورم برسیە زنبیلفروش کوتی بخلای چی تو نددی بی امنیش نمخواردوە بژنکی کوت اتو بچو بو حق زنبیلان اگر دایانی بینە اگر نەیاندایی ورە شکر خولای دەبین ژن زنبیلفروشی چو کوتی کویخادرك عرض خاتون بکە حق زنبیلکانمان بیداتی چمان نیە بخوین کویخادرك چو عرض خاتونی کرد خاتون کتی بیهینە ژوری حقی بدەمی درکوان هینایە ژوری خاتون کە چاوی پی کوت لە پلیکانان بە پیریوە هات ماچی کرد کوتی بشق خلای ورە نقل خوت و زنبیلفروشی بکە کوتی خاتون نیوی خلات هینا جرگت بریم جاری حق زنبیلانمان بدیە زوادمان نخواردوە جا لدوم بنیرە نقلت بو دکیرموە دست ژنی زنبیلفروشی ڭرد بردیە ڭنجخانی چارشیوی را خست بوی پر کرد هر چی کردی چارشیوکی بو هل ڭیرا کوشی پی ڭرتوە بوی پر کرد هتا پی هلڭیرا روی چوە مالی زنبیلفروش پی پیکنی کتی بو عمرم امن نتوانم اوانە لدم چومان بینم ژن بوی نانچیژن اتو او پولت بوچ هینا روی کە ارضی بزانم اگر روی کرت پاکی بو بە مار و دوپشك و کیسل بە نیو مالیدا بلاو بون حق زنبیلان نیوپنابلا کوتە ارضی کوتی عمرم اوانە دتوانی بریوە هتا اتو دیوە امنیش دچم نانی دکرم دیموە ژنکە کوتی دترسیم پیموە دن کوتی نا مترسە ضرریان نابی

کوانی عثمان بن عفان
او جامعه دست به قران
پنهام به تو شاه جبار
زنبیل‌فروش نیما اختیار
دستی گرت خوی فریدا خوار
جبرئیل چست و تیار
خوش له آسمانی هاته خوار
زنبیل‌فروشی گرت به زار
دلی عمرم نه‌کیشی زحمتی
پنهام به تو صاحب‌سجود
الحمد لله یا ودود
در چوم لوی زلالتی
پنهام به تو لایزالی
واسطهٔ گیان‌دار و بی گیانی
پیم هیچ نیه دنیای فانی
بی بش نبوم له رحمتی
پنهام به تو تو نادری
هم کریمی هم قدری
چی تو نی‌کژی نه‌مری
بشم کوتوته فرصتی
شدرم به تو پادشای جبار
خلاص دکی عبد هزار
هیچ کس نات‌بی‌نی پروردگار
دنیا بو کس نیه باقی‌دار
چون کوتمه باری فرصتی

بو ویت کرده دوازده طریق
فرعون تی‌دا کرد غریق
او بو جزای شرکتی
پنهام به تو شاه کبیر
یوسف طللفیک بو شبت و زیر
بران بردیان اوینیانه بیر
بردت لمصرت کرد به میر
نیزیکت کرد له راحتی
برانه چیان کرد قومی کفار
منجنیق‌یان اوینه خوار
ابراهیمیان نا بو د نار
بی بش نبو له رحمتی
هودی لنیو بحری دلان
چل سالیشت او دا خلانت
فتّاح باب رحمتی
آدم گنمی خوارت کردی گناه
توبت قبول کرد ربّنا
هر توی باب سلطنتی
زکریایان بمشاران بری
ایوب لسر کرمان دری
لوانی عیسی روشن‌چراغ
خویندی انجیل خوش‌دماغ
کی بو له کن خلای گستاخ
موسی بن عمران نمان
کوا ابوبکر صدیق مستمان

لبو روژی مصلحتی
خاتون دلی دنا لاو وها نابی
اگر فیل بی ابرها بی
له چنگانم خلاص نابی
نیه سر پی مصلحتی
خاتون دلی لاو مکه چه قسو چه دنگان
بچیه نیوانی حوت بحر نهنگان
خلاص نابی بچه رنگان
نیه سر پی مصلحتی
لاو دلی خاتونی بارکان و توره
مصلحت ناکری بزوره
ایواره دابی انگوره
تی دهبینین مصلحتی
خاتون بوی قسی دل بو غنی
خوش هلستا زو پیکنی
دلی لاو وات دینمه سر هدایتی
لاو وای کرد خلاص لداوی
عنجتی کرت به پیشاوی
بچی له بالاخانان خوی باوی
بشکم خلاص ببی لداوی
خاتون خریه جارییه بنادری
مسینی آوی هل گری
بیبه بو جی لاو تیوه دی
لاو هاوار دکا شیخ و ملی
موسی لنیو بحر عمیق

پیر و عاقل و هوش و ژیره
حاضر نین لیره چی میره
بوت هات باز دولتی
لاو دلی خاتونی ممتازه
لیره تا شام و شیرازه
ناموی دولت و بازه
من نیم لگوین خیانتی
خاتون دلی لاو شلیوه
وره ناو ریحان و سیوه
شکر بملیسه بلیوه
تا روژ صبحیتی
خاتون دلی لاوی رواله
وره ناو دوشک و پاله
تیک ور ده او زلف و خاله
دوره روژ اخرتی
لاو دلی خاتونه زلف و خال توم حریری
قابل به خوت به بژن میری
حد نیه رنک من فقیری
او ناکری دستیان داتی
خاتون دلی دنا لاو پسته و چوغلت دبر دکم
بو زیر سورت رو دکم
پاك ئیانت کسك و سور دکم
دهتکم به چرخ داوتی
لاو دلی خاتونی پسته و چوغلی خوم چاترن
لشی ئناهبار پی وشرن

خاتون لبرجان را دمینی
بدل و به جانی دەحبینی
لاو کوته پی محبتی
او جاریهٔ خوف خدینه
دین بحله به لاو دلینه
لاو میر لنوی زنبیل دوینه
او بچاکیت بانک کتی
لاو بوی قسی بو خوشحاله
روی کرده مال چوته حاله
علی ڤرت زنبیل چی بو
روی کرده دیوانی میران
یک له دوای وی هات بخواردا
لاو میر لنوی مطلب دیدار دا
بو خوت وره بکه قیمتی
لاو بەوی فعلی نزانی
بی ترس و خوف چو بو خانی
دربی دا چنک درکوانی
قایم کرا لای دەشتی
لاو نوری دربه نماوه
لی تغییر بو رنک و بوه
تا بمداتی زحمتی
لاو بانک دکا میر کباره
اتو بمنت هیه چی کاره
تا پیک ببینم حاجتی
خاتون دلی لاوه فقیره

دست له کرسی و فرمان حق بو
عاشق به لقاء و شوق بو
صنعات زنبیل له کن بو
او پی بی‌دیری کلفتی
او لاویکی تازه روال
ترکی کرد شاهی و ثنج و مال
له ترس موت مال کرد بتال
خوی مشغول کرد بطاعتی
او لاویکی ایساده بو
هر دم له سر ری جاده بو
باصل پادشازاده بو
دایم له ذکر و طاعتی
کوا یاقب صاحب‌کمال
عبادت کرد هشتی و دو سال
له ترس موت مال کرد بتال
خوی مشغول کرد بطاعتی
سالی دری دوازده مدام
صنعات ویم وی خاص و عام
روژی دکرد زنبیل تمام
دی‌برده شار بو قیمتی
چی روژیک لاو زنبیل دبست
دی‌برده بازیری بقصت
نعمتی شوی پی کوته دست
لاو قنعه بقسمتی
چی روژیک لاو زنبیلان دینی

سر و برڤان پی‌کوه بڤورینوه جلیان ڤورینوه هر دوک روت رجال روین هتا ڤیشتنه شاریکی چونه مالیکی صاحب‌مال کتی جوتی دزانی کوتی بلی دزانم ڤرتیان به نوکر صبحینی زو جوتیکیان ڤ دایه کوتیان برو جوتی بکه کوتی بخولای جوتم کم کردوه بوم لی بخرن تا فیر دبم بریکی جوت کرد هتوه دستی دا بیل و سوته خریک بین رشتنی بو صبحینی چووه جوتی جوتی کرد هتا ایواری هاتوه به صاحب‌مال کوتی خلا هل ناڤری ناتوانم بکیف صاحب بکم اویشی بجی بیشت و چو شاریک دی دستی به زنبیل کردنی کرد روژی دچو کلوشی خر دکردوه دی‌هینا دی‌کرد بزنبیله له بزاری دیفروت تماشای کرد او کلوشه ڤاران و مر له پریزان دی‌خون کوتی خلا هل‌ناڤری امن روزی او بسته‌زمانانه بدبرم او کاریشی نکرد چو شاریکی دی لو شاری شوی دخوی هات صبحینی هلستا چو سر دریای دنیوه‌راست او دریای جزیرک بو میشیکی لی بو کوتی خلایه اوه کس نی‌چقاندوه چی بکم لبر دریای ریم نیه بچم بریک بینم بو خوم بی‌کمه زنبیل اوی روژی زور بعاجزی هاتوه شوی دخوی دا پی‌یان کوت صبحینی برو لو میشیدا بو خوت کاری بکه زو هلستا چو سر دریایی بی پایه لدریایی دا هیچ پی تر نه‌بو هتوه شاری دستی به زنبیل خوی کرد خاتونی پادشای شوی زنبیلفروشی دخوی دی عاشق بوی بو

حق دل وره جاری بجوش
جمیک جه عشقا می بنوش
کین قصیتی زنبیلفروش
فصیح دکم حکایتی
دستده کرسی صنعتی

## XIV.

### بیت زنبیل‌فروش

زنبیل‌فروش پادشا بو روژیکی سوار بو چو راوی لە سر قبران غلبیەن بو پرسی اوە چیە کتیان پیاویکی مردوە پادشا کوتی امن دبی بچم بزانم قبر چلونە پادشا هلستا ھاتە سر قبران پیاوەکیان ھینا د قبریان نا بردیان پی رایل کرد قریان دا دا ڤلیان پی دا کرد پادشا کوتی اوە رعیتە ملا جی منیش ھر وا دبی ملا کوتی اوە رعیتە خرجی ئەدا بیگاری دکا جی وی لە جی تو خوشترە بشکم اتو فریدەن نەیلن لیرە بەمینی کوتی آخر امنیش دمرم ملا کوتی اتو دایکت ماوە بابت ماوە آخر اتوش ھر دمری کوتی ملا اڤر امن مردم لیفیکی دوشگیکی بوم را ناخن کوتی ناوالله ھیچت بو را ناخن کوتی بلا بروینوە جاری را تیشن امن ایدی پادشایتی ناکم ھاتنوە مالی دابزی کوتی بابە کس پیم نلی پادشا ژنی خوی بانگ کردە دری کوتی امن او پادشایتیم ناوی مردنی لدوە اتوش کیف خوتە امن خداحافظ ژنکە کوتی بابم لبابت مقولتر نیە اتو دست لە پادشایتی ھل بگری امن دست لە خنمتی ھل ناڤرم ھر جیدی اتو بروی امنیش دیم لە شاری و در کوت ژنەکشی و دو کوت بە پی‌یان رویین ڤینە ڤاوانی ڤاوان لە نیو ڤرانی بو پادشا کوتی ڤاوان بقربانت بم ورە جلان بەڤورینوە سر و برڤیان پی‌لوە ڤورینوە روی خانم رە دوی کوت تماشایان کرد ژنیکی کور فقیر بە ری‌دا دروی خنم کتی ورە

له سندوسی دکم خویریه
قر کتنی دەسلات بمن نیه
دەسلات به من نماوه
حاشا و ماداللە لو کارانه
دەزانم دمگری قرعانه
ناتوانم له بر فرجاللە خانه
لیم حرام بو روی نانی
جا خاتون گلەزر خوی زانی

اوه رحمن بکر به ناوه
او بندی کردوه تواوه
خذمت به دولت المانی کراوه
صاحب مملکت عجمی گراوه
همو کاری کرد تواوه

---

قرارمان تا بهاری
هتا بخیر خیل دیتوه خواری
جا بو خوم دثلی دکم ثفتاری
جا نیه چی دی بثری بناری
قر کتی پی بلی پی نادم موتمانی
هتا بوم نخوا قرانی
بوم دانی قول و قراری
هتا وکو خیل دینه خواری
بکر شیخان هات ثراوه
قسی بو ثلهزری هیناوه
قرانی بو خوارد تواوه
که هاتم نایم بدواوه
چی دیم آبرو نکا بلاوه
قر له بو شوی ثراوه
لشکری خوی کرد بلاوه
سلطان به شاه عباسی تی ثیاندیه
اثر دلی تاراجی بکم به یکی جاریکیه
او شر و معرکه چیه
شاه عباس وای ثتیه
اثر دغرموی دری دکم خوبیریه
ده سلطانی زیادتر کسم نیه
سلطان وای دا جوابی ویه
ایختیار وی به من نیه
فرج‌الله خان کاغذی نوسیه
حاشا و مادالله کری من نیه

کاریک ڠوره قوماوه
الای حقیبان هل داوه
دست بدعوایه کراوه
تا نیورو لیکیان داوه
لشکری بغدایه شکاوه
سر بیداغان بر دراوه
هر کسه بو خوی ڠراوه
قر روستمه راوستاوه
شاش و پر پالیان ویکڤ داوه
پالی ویکڤ دا له زمانی
هر وکو بور بیانی
که عیلات عموی پی زانی
دیان ڠوت هتا دوینی دیکرد شوانی
او رو که بور بیانی
دنیا بو شری دهزانی
بکر شیخان هت لو لاوه
کاغذی ختون ڠلهزری هیناوه
ماچی کرد له سر چاوی دا ناوه
بکر شیخان کتی قربان چی نوسراوه
کتی دعا و سلاوی دا ناوه
فرمویه بو له روی بابم ور ڠراوه
زور خراپم لی قوماوه
اوا خطای من ڠیراوه
پی بلی بڠریتوه دواوه
قراره دڠلم رو ناوه

لی ڠری تا سالیک دیه
بلا ڠرمینی له سر نهبیه
دوری بڠره به یکجاریکیه
لی دستینی چاری نیه
ویستا حقت دڠل بغدایه چیه
قر دلی بکر کار تواوه
تازه ناچموه به دواوه
لشکر و قوشنم هیناوه
سندوسم لی باجی ماوه
بوته شر له زمانی
جوابی او قسی درا به سلطانی
دنیا دهمینی به ویرانی
له بر کری فرج‌الله خانی
سلطان دلی را مهمینن
اصفهانی تی بهڠیبینن
اڠر قسم نهسملینن
قط نابی عجمیک بی‌مینن
هر چی شیعه بی‌بتلینن
او خبره هات ڠراوه
به میر بغدایه دراوه
اڠر میر وا دزانی
شهقڤن دوته دیوانی
دلی بیننه دری جبهخنی
سربازم بو بدن له سانی
سرباز له سان راوستاوه

اتو بو او پیاوی جوابت چیه
اویش پیاویک کم نیه
بو توش عیب و شورەیه
دست هل گرتنی له بو نیه
مگر دولت لیکڤ درین به یکجاریکیه
هیچ صفای له بو تو نیه
بغیر از کویرەوریه
کتی بکر اتو بوچ له من دکی حکمی
کچی خوم نادم به عجمی
صبحینی بینه دعوایه
خبری له بو قری برد
قر صبحینی خوی درست کرد
صبحینی فصل چیشتناوه
خبر بقری دراوه
اوا لشکر هات لو لاوه
دار و بردی دا پوشاوه
هلی و بگریوه بدواوه
قر دلی نمرم بەمینم
بغدایه پاک دشیوینم
یا سر خوم دەدورینم
یانه گلەزری دستینم
بکر شیخان وای گتیه
بو تو عیب و شورەیه
او شرم هیچ پی چا نیه
حمد باشاغان کویستنی نیه

اڭر او قسەيان ڭيراوە بو قريە
كتى لوى وايە هر او دمە كە دڭلم دكردوە شوانيە
او معنايانە همو چيە
او كارانە وا پيبك نايە
تازە نەهاتومە تكايە
يان بمداتى يا و خو كوى لە دعوايە
دعواى دڭل دكم بە دل و جانە
هتا كنڭى دڭرى او بيانوانە
لشكرى اصفهانى دينم بجاريكى بغدايە دكم ويرانە
سواريكى نارد بە چپر و بە روانە
تشريف بكر شيخان بينە ايركانە
كە خبر لە بكرى شيخان ڭراوە
بە پلەپل هات لو لاوە
لقرى كردوە سلاوە
دلى برالە چە داويكە بو منت رو ناوە
دلى لە تو وايە هر او قر شوان ماوە
ڭفتارە لبو تورم رو ناوە
بغدايە دكم بلاوە
آخر زورم لە تو ڭيراوە
دلى امنيش خذمتم پى كراوە
خبرم لە خاتونى ڭيراوە
بە خشكم قبول كراوە
بو تو چاكە او نو لاوە
بكر چو بە قاصديە
بە حمد باشاغان دلى بيك جاركيە

چندم خذمت مر و برخی وی کرد بشوانی
امن خوم کرده نوکریکی لمترین اوم دانا له جی فرج‌الله‌خانی
خوی لمن نه‌ناس کرد قدر منی نه‌زانی
ایدی نه‌لی له روی هل نایه
یا دبی خاتونیم داتی یا دبی دڭلم بکا دعوایه
او نیزانی اڭر او حمد باشاغانه
بابمیش فرج‌الله خانه
بکر اڭر فکری بکا صد تاجر و تجاری ولو وی ده مملکت پادشای دایه
قاصدیکی بنیرنه کن خاتون ڭلەزری بزانن بو بکریه له من دکا حاشایه
اڭر جوابی منی دا دڭریموه بدوایه
اڭر بو بکر شیتخان بی بوی درست دکم سیر و صحبت و صفایه
او خبره به بکری درایه کتی نمزانی کری فرج‌الله خنیمه کویرایم دایه
اڭر خاتون ڭلەزری بدن بقری هر چند خرج و مخارجیشه بو خوم دیکیشم له دنیایه
بو خاطر قری خاتون ڭلەزرم به خشکی قبول کرد بو خوم دبم به برایه
دشقمی مقصودیان حصل بی لیکدری بدبیننوه کام و صفایه
اڭر خبری له حمد باشاغان دەکرد یقینه
دیڭوت بخلای کچی من لایق بکری فرج‌الله خنی نیه
لیم قبول ناکا سلطان امینه
اڭر بیت و بیدمی دبی عرضی بکم بدل و یقینه

بکر شیخان عرضت بکم قسیک دیه
راوستا خیل بگریتوه سالیکی دیه
لوی دهمی به یکجارکیه
بچو پی بلی جا بزانه جوابی چیه
اگر بکری شیخان جوابی بو قری هیناوه
اگر عرضی کرد و همو قسی بو گراوه
کتی یا خلا به خیریوه زحمتت بو من کیشاوه
قر له راستوه گراوه بدواوه
گیه جی هواری بانگیک خوشی لی داوه
گیر نهبو هتا هات گیه سندوسی جی‌نشینی کرد تواوه
عرض بابی کرد له اصفهانی گیراوه
اگر فرج‌الله خان وا دزانی
دچو دبو به عرضچی له کری خوی له شای اصفهانی
شا فرموی او له گرمینی امه له کویستانی
اوه کاریک زور گوربه مگر سلطان استنبولی پی بزانی
شاه فرموی به فرج‌الله خانی
اوه کاریک زور به قابلت نیه
له کنم روم کچی نادا به عجمیه
البته کری تو عوامه چه اگای لخوی نیه
دنا مملکت من کچی وک حمد باشاغان تی دا نیه

شاعباس کتی فرج‌اللهخان کاغذیک بنوسه لقری نیوی او کچی جیه کاغذی بو قری نارد قر کتی له روم هلنایه کاغذی بو شاه عباسی بنوسموه لشکر برد و چو سر حمد باشاغان خبری دا به حمد باشاغان

امنم کری فرج‌الله خانی

سر قنداریم راڭرت ڭلیکمان پیکوه قسی کردیه
کتی امن قرم کری فرج‌الله خنم ایستن له اصفهانی شاه‌عباس
دڭل بابم لیم ددا ڭلدیه
اڭر ختون ڭلەزریم نەداتی بغدایی لی دکم ویرانه
اڭر حمد بشاغان او قسی بیست تواوه
دیڭوت صبری بڭره بدر هتا قسیکی له منی دەزانم تواوه
ناردیه دن ختون ڭلەزری او خبره چیه دلیین زبانت ده ڤریو ناوه
دڭل شوانیک خوریه دلی بابه امن عیلیک سراوانم بی خدانه
اتوش مزنیک ڭورەی صحب همو عیلانه
ردن‌سپی دولتانی چاکت دەنسی سلطانه
امن صاحب دولتم دبی بدوینم همو شوان و ڭاوانه
اڭر امن همو دسیک ندوینم نەمبینوه ڭذرانه
بابه تقصیر من چیه خلق ددا او قسانه
حمد باشاغان دلی ناردویته کن امن بو خوازبینیه
او کری فرج‌اللهخنی حکم سندوسیه
کتی بابه دڭل امن مده ڭفتوڭویه
اڭر به سڭیدم بدی اختیار من هر به تویه
حمد باشاغان بانڭی کردوه بدر شیخنه
امن ختون ڭلەزرم دواندوه اتوش بو خوت بچو قسیکی لی بزانه
بکری شیخان وای ڭتیه
قربان به ریش سپیوه ره من نکوی دلالیه
دبی ژنان بنیری بزانی قسی چیه
حمد باشاغان کتی جا او تڭبیره به من نیه

وره ده مابين خوف و رجيدا به امنت بچو حواليكم بو له حمد باشاغن بزانه
بو خاطر خلا و پيغمبران بكر بوم بكه اوى ثبتى
بچو كن حمد باشاغن بلى قر كرى فرج‌اللەخانى ديكوت خاتون ئلەزريم بداتى
ملى قر شيت و اذى له خوى نيه
امن ساله‌وختيكه دستم له حكمتى عل‌ترته شەعباس اصفهانى دئل فرج‌الله خانى لبر اوخى امنيان به نحلت كرديه
دزانم ختون ئلەزر دئل توش سويندخوره بلا ژن دينى نيه
اتو امين عر جوار دولتانى او كارش بو تو عيبى نيه
بچو بوم لى بزانه قسيك صحيه
والله يا اصفهانى بقر دەدم يا رى كويستانانى لى قدغه دەم به يك جاركيه
به يك جاركى بچو كارم بكه تواوه
شرمت پى نەبى سر قنارى بگيره بدواوه
يانه سندوسى بقر دەدم يانه بغدايه دەشيوينم تواوه
بدرى شيخان له شرمى قر ئراوه
عتا وكى له نيو خيل حمد باشاغان تنبليت خوى بعرضى‌دا داوه
چو له حمد باشاغان دىرد سلام و سلاوه
حمد باشاغان دلى وعليك السلام خيره شدر وا قنارت ئراوه
كتى نازانم چت عرض بكم قصدم عيبى ئلەيم نسر نيه
برى راستى خوم دا دەرويم پيمديك لوازى بردى بانك منى كرديه
ئلەيم قسه دئل كرد عتا دوايه نمزانى ليه و دويندريه

قر دلی اگر نمرم بژیم بەمینم
دبی بە مملکت اصفهانی رابگیبینم
توپ و توپخانە و لشکری بو سر بغدایە دینم
ری لویستانی دەبستم ژرمینی دشیوینم
بکری شیخان دلی بە خلای بە شواندن پیکێ نابن او کارانە
حمد باشاغان پیاویکی مقولە شاری بغدایە شریک ژورە و ژرانە
بکری شیخان دلی جاری لو قسانە ژرێ خلا بکا ختون ثلەزر چا بەبی لو دردی خلاص بی او بستزمانە
قر دلی بکر اتو بکری شیخانی
قسی چاکت بزاری دا نایە
ربی نلیل بی لە چاوان نکویە بر الای حضرت رسول اللەیە
ختون ثلەزر انشاللە لو دردی رزگار دبی چونکە دگل امنی خواردوە کلام اللەیە
اوا دچموە سندوسی بوی درست دەم تیپ و سپاە و الایە
ربی هر دوك چوت لویر بی اتو بو جی قسی چاکت بزاری دا نایە
بدر دلی امن چە بدم رێبوارم تاجری هر چوار دونێنم
اوی دیومە هر وای دەزانم
امنیش سویندخوری ختون ثلەزرم بوی وا سرەوبرانم
مداخل لە بغدایە دەم خوم بە نوکر فرج‌اللە خنی حاکم سندوسی دەزانم
قر دلی بدر دلت خوش کردم بو قسانە
خلق گوی خوارد لە گوی بابیان دەیانگوت شیتە بکری شیخانە

قر دلی ھی بکر بکری شیتنه
خلا چلونت لی قبول دک دگل امن دکیوه او قسنه
چپدم دل عیلاتی کردوم گه گه دبم به نوکر گاه گه دبم به شوانه
اگر لیم معیّن بی نەخوشیک ھلاکه راسته او قسنه
بو خوم دەبم به یلاچی دچم دینمه سری ارسطو و حکیمیک ودو نفمانه
دشقم خلا توفیق بدا راست بەبینوه شای به دنیایه نوجوانه
بکر دلی بخلای نەخوش بو خلقی ھمو بوی راوستابو له
امین امین فقی و ملایانیان دیندنوه سری نه بوی بخوینوه
یاسینی اگر یاسینیان کردبو تواوه
چاوی ھلات زبانی کراوه
نوکر و پیشخذمتان مزدەیان لبو حمد باشاغان ھیناوه
حمد بشاغان شکرانی دەبژارد گلیک لبر خلای پاراوه
اگر امنیش زانم ختون گلەزر چا بو قمشر خوم راکیشا ختوم واوه
قر دلی اگر نمرم بژیم بەمینم
دبی بی‌سوعبتیکی به حمد باشاغان بدنوینم
ولات بغدایی پیوه بشیوینم
بکر دلی اتو لوی مده فکری
پیاوی شوانەویله و بی‌کس دگل عیلاتی چی پی ناکری
قر دلی اتو بزانه قسی او تاجرەی ھمو خوراییه
لتو وا بو ھمو شتیک چرچی‌گری بازاریه
گزگز چیتی دفروشی له تو وا بو ھمو شتیک چرچی‌گری بازاریه

قو بانگی دَدا کاروانی ای کروانی
اتو هیچ حوالی خیل حمد باشغان نازانی
بکو تنی امن کروانم
رئیس گرمینی و کویستنم
حوال خیل حمد باشغان زور چاک دهزانم
امشو سه شوه له نیو خیل حمد باشاغان میوانم
اگر خبر خیل حمد باشاغان لمن دپرسی ختون گلهزر ناخوشه دردی گلیک گرانه
عزیزم امن اوی شوی لوی بوم بویان کرده صدقه چل شکی جوت ددانه
امنی چومه سری نه زمانی دگری نه حل دینی چاوانه
نهخوشیک هیند گرانه له تنم حتا ایواری نڑی بستزمنه
قو بانگ ددا بکو بکوی شیاخنی
موت بکوی له سر زبانی .
بکو بکوی مال شیواوه
یا رب سفرت نهبی تواوه
خیری له جوانی خوت نهبینی کوبرت بهبی هر دوک چاوه
اوه چه خبریکه لبو من مالوبیرانت هیناوه
یا رب سفری خیرت نهبی بسلامتی نگریوه بدواوه
بدو دلی اتو خلقی کویی له ختون گلهزری دهلی پرسیاری
ختون گلهزر هر زمان‌خوشه به شوان و گوانن دهکاتوه بیگاری
اگر خیالی بار دکا بسکیکی دنی ده خنی یکی دنی ده ژنگری
حنیی ختون گلهزری دلی روژی منوره نه مبین ارض و آسمنی دکتوه کاری
مخلوقات گذرانی له بر ددا له صبحینی حتا ایواری

ڤر دلی ھی بگر بکری شیننه

خلا چلونت لی قبول دَک دگل امن دکیوه او قسنه

چپدم دل عیلالی کردوم گه گه دبم به نوکر گه گه دبم به شوانه

اگر نیم معیّن بی نەخوشیک ھلاله راسته او قسانه

بو خوم دەبم به یلچی دچم دینمه سری ارسطو و حکیمیک وکو لقمانه

دشقم خلا توفیق بدا راست بەبیتوه شای به دنیایه نوجوانه

بگر دلی بخلای نەخوش بو خلقی ھمو بوی راوستابو له

امین امین فقی و ملاینین دینانوه سری نه بوی بخوینوه

یاسینی اگر یاسینیان کردبو تواوه

چاوی ھلات زبنی کراوه

نوکر و پیشخذمتان مزدەیان لبو حمد بشاغن ھیناوه

حمد بشاغن شکرانی دەبژارد گلیک لبر خلای پاراوه

اگر امنیش زانم ختون گلەزر چا بو قطار خوم راکیشا ھتوم واوه

ڤر دلی اگر نمرم بژیم بەمینم

دبی بی‌سوعبتیکی به حمد باشاغن بەنوینم

ولات بغدایی پیوه بشیوینم

بگر دلی اتو لوی مکه فکری

پیاوی شوانەویله و بی‌کس دگل عیلاتی چی پی ناکری

ڤر دلی اتو بزانه قسی او تاجرەی ھمو خوراییه

لتو وا بو ھمو شتیک چرچی‌گری بازاریه

گزگز چیتی دفروشی له تو وا بو ھمو شتیک چرچی‌گری بازاریه

قر بانگی دکا کاروانی ای کاروانی
اتو هیچ حوالی خیل حمد باشغان نازانی
بکر لتی امن کاروانم
رئیس گرمینی و کویستانم
حوال خیل حمد باشغان زور چاك دەزانم
امشو سه شوه له نیو خیل حمد باشاغان میوانم
اگر خبر خیل حمد باشغان لمن دپرسی ختون گلەزر ناخوشه دردی گلیکی گرانه
عزیزم امن اوی شوی لوی بوم بویان کرده صدقه چل شکی جوت ددانه
امنی چومه سری نه زمنی دگری نه هل دینی چاوانه
نەخوشیکی هیند گرانه له تنم هتا ایواری نزی بستزمەنه
قر بانگ دکا بکر بکری شیخانی
موت بکوی له سر زبانی
بکر بکری مال شیواوه
یا رب سفرت نەبی تواوه
خیری له جوانی خوت نەبینی کویرت بەبی هر دوك چاوه
اوه چه خبریکه لبو من مالویرانت هیناوه
یا رب سفری خیرت نەبی بسلامتی نگریوه بدواوه
بدر دلی اتو خلقی کوبی له ختون گلەزری دەلی پرسیاری
ختون گلەزر هر زمان خوشه به شوان و گوانن دەکتوه بیگاری
اگر خیلی بار دکا بسکیکی دنی ده خنی یکی دنی ده زنگاری
هنیبی ختون گلەزری دلی روژی منوره له مبیین ارض و آسمانی ددتوه کاری
مخلوقات گذرانی له بر دد له صبحینی هتا ایواری

خوی لی کردومه کویک گردن‌رش خوی گل کیشا کیل
کویستانی
قر بی دایک و ببی بجی عیشت نبو کوره‌وری و خفتی
دوی دنیایه
هر چند دل له چوی او دفرببی دی قط له چاوی دس نایه
اگر راز و گلەیان لیک دبو تواوه
ختون بو گرمینی گرمسیر دروی قر له ولاتی کویستانی به
جی ماوه
حمد باشغان دلی دذ روله قره دولت زید و مال‌آوا
قر دلی له خوم خانەخراب و مالویرانی
امن چلون به بی‌دسی له دور ولاتی بکم گذرانی
خیلی حمد باشاغن باری ددرد ترلی ددرد او مدنه
قر و دو خیلات دکوت بی سر و بی ازمانه
اگر حمد بشاغان داخل به گرمینی دبو بکری شیخنی
دبو میوانه
سه روژانی قرار دگرت بو تجارتی دچو روی دکرده شرانه
قر اوا له بیبان تمشای ریانی ددرد کاروانیک دیاره
دلی بچم حوال او کاروانی بکم پرسیاره
او کاروانه نازانم نه گدیه نه گداره
نه وشتره نه وشتربره
نه پیدەیه نه سواره
بچم حوالیی حمد بشغان له وی بکم پرسیره

قر دیزانی بکری شیخان حزی له ختون گلەزری دک بکری شیخنیش دیزانی قر حزی له ختونی ددا قر خلقی کویستنی بو بکریش خلقی گرمینی بو اوا دروا بو تجارتی

خوی لە من کردە کویکی ڤردن‌رش خوی هەل‌کیشا کیل لە کویستانی
قر بی دایک‌وباب بجی مە نبو خم و خفتی دوی دنیایە
هر چند گل لە چوی او کفربابی دی لە چاوی قند کسی نایە
قر دلی خاتونی خاتون ڤلەزر ڤینە
اتو دچیوە ڤرمینی ڤرمسیر امن بجی دمینم لیرەکنە
امن خمڤبینم اتوش نات‌بینوە ڤذرانە
خاتون ڤلەزر دترسیم لە بیرم بکی امنیش لیرە بەبم سرەویرانە
خاتون ڤلەزر ورە سویندیکت بو بخوم بحدیث و یکیک بکلم اللەیە
اوە درویوە ڤرمینی ڤرمسیر امن بو دن عیچ بنی ادمیانم لە روی هل نایە
قر دلی خاتون عزیزم دەزانم دڤل بغدایم لی دقومی شر و دعوایە
خاتون بو خاطر خلا و پیغمبران پیم مدە دعوایە
دەزانم ڤیچلم لی دقومی دڤل شری بغدایە
خاتون دلی قرە اتو اڤر هتیە او ولاتە خوت لرە غریبیک قلندرە
عزیزم ویستنا نە بر امن نە مال و حال خوت بوی در بدرە
جا اڤر امن بەروم اتو کس نیە نی بکی نظرە
امنیش سویندت بو دخوم بذات خلای و بە کلام اللە اکبرە
امن حلال دنیایە لە خوم حرام دم هتا ودو قر لە ڤرمینی ڤرمسیرم دینیتوە درە
قر دلی نایە امرو دو روژە دنگی خاتون ڤلەزرم لە بنی گویان نایە

به جان بگریوه بدواوه خو من در بند نیم دمبردی دگل خوم امّا
مور و کاغذم به دوێتان داوه اوی روژیان چدر گویزتوه بو مبارکی
نه جیبیکی دیـن هل داوه قر دگیبه خاتون گلەزری دیگوت
خاتونی گیانه
تیریکت لی دام زور بی درمنه
هیچ خبرت زانیوه ببی من له اصفهنی صدی وه بابی توی
له بر دستنه
دستم له پدشیتی هل گرتوه هاتوم له بر اتو بوم به شوانه
ویستا وا بابت دلی لیره مەمینه امن دروم اتو به جی بەمینه
لیرەکنه
اگر امن له بر خاطر تو نەبی دنیرم له سندوسی بینتوه سرباز
و توپخـنه
به خلای امن آبروی به هزار سلم چوه له نیو عیلانه
ینه پالی بقر ندم ینه تلان دکم حمد بشاغنه
نیدلم اتو برنوه گرمینی امن بەبم بی خدانه
ختون دلی قره ملویران اگر خوت بی خدان کرد امنیشت
کردوه بی صلایه
نەبو نه روژان له پیش او غسی دا خوت اشدرا بکردایه
ویستا نه چه بکم چم له دست نیه
قر دلی آخر امنیش بوم بی صلایه
ویستا که چبکم چم له دست نیه
ری ولات سندوسیشم لی بسترا دگل ای بغدایه
ختون گلەزر دروا له بو دویستنی نه عظیم قر بی دایکوبب
بجی نەمینی لبو خم و خفتی دوی دنیایه
قر دلی نایه چندی گز گلەزر بریکله دکم نایه

قر دلی ختونی عمر و چوم بابم رابری اصفهنیه له پیش پادشای راوستاوه
بو خوم حکم سندوسی بوم ولایتم له خوم تیخ داوه
چندم کوچک و تلار عزیز و شیرینم لیم به جی موه
چندم حدود بی‌نشانه له یختخنان عموی محثلن کس نیه پی‌یان بدتوه رشراوه
ایست نوکر و تبعی من عمو تزیه‌دارن دلین قر لری فرج‌اللهخنی نمو
ختون آوری توم تی بر بوه عمو جگرم سوتاوه
ختون امن بویکی مردوم ویستا به منتم دهبیی چوریک آوه

شدایتیان کرد له حمد باشغان ثتیان ختون ثلهزر عشق قری بوه حمد بشاغن پی زانی که قر عاشق ختون ثلهزری بوه کتی مصلحته خیلی آوا بدم بو ژمینی کس نزانی جا عینی تدارکی ژت خیلی برینوه او دیوی صبحینی زو خیلی بردهوه بو ژمینی قر چو سراوی دستی کرد به ژینی حمد باشغان زانی له دوی نارد کتی روله وره امن دست له تو علناژم هر چند دراوت دوی دهت دمی مبه نوکر کس عنا سلیکی دی خیل دیتوه دیسان وروه لنه خوم بهبه شریک مل من

قر دلی

له خوم بی‌لس و بی‌صلایه
آوریدم ژتوه هیچ چرم نیه
جا من له تو چلون بستینم مال دنییه
اگر ادنم بدی امن دیموه ژمینی ژمسیر دبیشموه جفیه
حمد بشغان دلی روله اوه نابی ندری اتو خلفی کویستانی
بو ژمینی برم لیم قبول نادری چندت زیر و زنبر دهمی به دل و

قر دلی خاتونی خداوند عالمین دست ده عمرت ڤری
له نعمه‌کان بهشتی اتوم پی چاتری
اوی اتو فرموت به قری غربتی پی دڤری
تاوی لرزی نوبتی ڤرتومی ددانم ددانی نه‌ڤری
له خوشیان چاوم کم‌بینا بوه جامی تو دستم نه‌ڤری
کس ری ناکوی عیب و عاران لتو بڤری
اڤر بلیم ببم ماقولتره بوم ده‌بی‌ته کفری
اڤر بلیم باپیرم ڤوره‌یه خلا لیم هلنه‌ڤری
خاتون حمد باشاغان امن میوانم دبی قدرم راڤری
اتو خانه‌خوی دبی ده غریبان بفکری
اتو نجیب‌زادی کس نبی به بی‌مقصود نه درکی تو بمری
نابی خیالیک بکیوه له تیپ و له قوشن و له لشکری
دلی اڤر پیاو دلعلاکی ندا نیه لپنک شوانان و خوی نڤری
پیاو چلون چولپرستی دد دست له منصب هلدڤری
کاریک وا بکه اڤر خلاوند علمی لیت هلنڤری
وره چوریدم آوی به دمیوه بکه ڤول صندوق سر خوت دومینت
ای برادنت دشقمی جم دست تو لیم به‌بی به شف قر
بی دایک‌وبب له ولات غربت به بی‌دسی نمری
خاتون ڤله‌زر اڤر بو قری دینا آوه
دوباره له قری غریبی دلرد سلاوه
دیڤوت چونده پیلاو غریبیت و نه من غینه‌وه
غانی به دست خوم بلدمی آوه
نزانم لری کیی وات لی قوماوه
وره بو خاطر خلای نیوی خوت به من بلی تواوه
لبر نه‌نه‌سینی امن غیچ الفتم به تو نداوه

دترسیم امن ایره به جی بیلم نمسلمانیک بی خاتون
ثلەزری لە حمد بشعان بخوازی
روژم لی علت ثیشتە محل چیشت ھنگوی
زینی خوم ددا تدولی حمد بشغان یکی بژن‌باریک کیل‌ثردن
لبر خوی دا دبو چارشیویکی دارای دە پی خوی کردبو
جوتە کوشیک صغری دستی ددا دستیک افتاوه و مسینی
عرض‌رومی صبرصبر نرم‌نرم دختوه بو رازی سراوی
اوا دی لە قری بی دایک‌وباب دکا سلام و سلاوی
ھر دلی علیک السلام و رحمت الله خاتون کیل‌ثردنی
بلک‌چاوی
تدوی لرز و نویەتی ثرتومی وره بدست مبارکت بم‌دیه
چوریک آوی
ختون لە خوی نثرت بە عنوان و تکبر دستی ددا جمی
دچو سرچاوی کانی بازنە و ترمک و ثواره و انثوستیله لە
دستی خوی در دھینا لە جامی آوی دنا دبنی لە پیش
قری بی دایک‌وبابی رادثری
ھر لە بری پیینی ھند تون سری دوی ختونی دفکری
ھر چند دکا و دکرینی چە عیبینی لی نثری
دلی ھر اتو ببت ماقولە یی بە بپییرم لی ثورەتری
امن دترسیم شدیت خدات لی بکم دترسیم لیم بەبی بە کفری
اثر ھینده صحب حیلی بو لپنک شوانیه و استوی خوت دثری
اثر خوت بە پیەو دزانی بو ننیری لدوی سرباز و لشکری
اثر ھینده بعلمی بو دست لە حکماتی سندوسی ھلدثری
وە ندی جاریک یکت پی ھلخلتنی و استوی خوت بگری
دستم شل بو بو چی جمی آویم لی ور ناثری

اڤر لە سندوسی وە در دەکوتم بو اصفهنی دەتنە پیشم
وکیل و وزیر و مختار دە دیوانی
تخبیریان بوده ردم دیان ڤت لە شای بستینە انشاالله ری ڤذرانی
پیاویکی زور نجیب و عقل ڠنا دییوە لسر مملکت سندوسی
دانی
اڤر او قسنم دەبیستن تواوە
بعقل خوم پیاویکی زور صاحب دمانم لسر مملکت سندوسی
دا دەنەوە
ویستا زور خراپم دڤل خاتون ڤلەزری لی قوماوە
او خوشیم هیشتا لو خوشیان پی خوشترە اڤر همو سبینان
خاتون ڤلەزر دلی قر غریب او برخانە بینوە واوا
قر دلی لە خوم غریب و خانەویرانی
صد عرضەچیم بو ڠنا صبحینی هلدستم دەتمەوە دیوانی
حدود ڤرمینیم هبون لە پاختەختنی
دمڤوت زینیان لە پشتی کن تاجی و تولانم ببنە درکی
دیوانی
دمڤوت نوکران بنڠ دن سوارم بدن لسانی
امن ویستا او خوشیم پی خوشترە لو خوشیانە اڤر خاتون
ڤلەزر دلی مندو نبی عمو ایوارە و سبیینی
قر دلی خلایە او پیاو چدە لە توی لی بی راضی
اڤر روژ دبوە لە لایکم دبو توپ و توپخنە لە ایدیکم دنغی
موزیقە و سربازی
لە لای دیکم دل برینداربوە خاتون ڤلەزر ڤرتویە بغازی
اڤر خدا نخواستە بچموە حکمت سندوسی دیسان لە دلم
دبیتوە بە شین و تازی

عیندک دیان‌ڤت او کری پادشای ایرانیه عیندیکنیش دەیان‌ڤت اوە شاعزاده قاجرە
اڤر سوار دبوم لە سندوسی بو اصفهنی بچموە خذمت پادشای بکموە نظرە
اڤر داخل بە اصفهنی دبوم دو منزلم مابو فرج‌اللەخنی بابی خوم دنارد خبرە
پوست و پەلت ببم بو دعات دیڤت لسری بابت کوی زیر و اشرفیان بەبشینوە او بر او برە
اڤر داخل بە اصفهنی دبوم توپ و توپخانە و سرباز بە پیریموە دعات دەیان‌کرد او بر او برە
عیندیک دەیان‌ڤت اوە کری پادشای سەلوقە عیندیدیش دیان‌ڤت اوە کری فرج‌اللەخان قاجرە
ایستا چبکم برخولی حمد باشغان دچلینم او بر او برە
ویستا دستم بکوچن ردی شل بو پی‌یم لە کلاش دومان عتوتە درە
ایستا بە سر روت و بە پی پی‌خاوس برخ حمد باشاغان دکم او بر او برە
چندیم برغلدا کردون ناظر و نوکر و نشام و عسکرە
چند بی‌خدانن میرزا و پیاو دە محتبرە
کوانیین او پیاوانی رادەوستان دستو نظرە
ویستا برخ حمد باشاغن لە خرەخری بلینی دچلینم او بر او برە
او خوشیم ڤلیک لوان خوشیتر رادەبوی اڤر عمو ایوارە و سبینان خاتون ڤلەزر بلفظ شیرین دلی ماندو ندبی شاەزادە قرە

هیشتا اوم لە دور حوکمت بابم پی خوشترە اڤر همو ایوارە
و سبحینان ختون ڤلەزر بلفظیکی شیرین دلی مندو
نبی شاهزادە قرە
ڤر دلی بابم حاکم بو لە اصفهانی بو خوم میریتیم دکرت لە سندوسی
چندم لە دیوانی شل دەبو میرزای قبل و ایشک‌اقاسی
روژی هزار عرضەچیم دەهتە پای دیوانی داد هیندیکانم دڤوت
عرض هیندیکانم نەدپرسی
ویستە برخ حمد باشاغان لە خرەخرە بانینی دەچلینم لبر
روی تو بە پی پی‌خوسی
بزڤیک تیر و بە دوان برسی
ویستە او خوشیم ڤلیک لە دور حوکمات بابم پی خوشترە
اڤر همو ایوار و سبینان خاتون ڤلەزر باریکلە بلفظیک
شیرین لە قری بی دایک‌وباب دپرسی
ڤر دلی بابم حاکم بو لە اصفهانی امنیشیان طلب دکرد حکمم
دەهتە سرە
تدارکم دڤرت بزڤە و بنە چندم رنڤین دکردنوە نودرە
الام عل دکرد شیپوریان دەلیشا او بر او برە
همو نودران جقیان درست ددرد پریان دەدا لسرە
هیندکیان برڤیان عجمی بو هیندیکی لردەواری دکردوە برە
اڤر تدارکم بو دڤرتن لسانم دەدان لیم دەدرنوە نظرە
چی بکم ویستە غریبی شارانم لوان در بدرە
کرکی کردیم دبر دایە کلاوی جوارڤوبچکم لسرە
د ورە عزیزم ایستە ڤوچان کردیم بمستوبە بە کلاشی دومن
دکم او بر او برە
اڤر سوار دبوم الایان لە دو رادکیشام لوزوی سوارانم دکوتوە سرە

دڤیشت کتیان بابم له چی دڤری کتی له شوانیکی له برخوانیکی دڤریم چون بخـتون ڤلەزریان ڤت کریک جوان له شوانیه دڤری اتوش چی شوانت نیه اڤر خاتون ڤلەزر تماشای کرد کره جحیلیک زور جوان بو کتی کره شوانیبت پی دکری کتی بلی قربان باب و باپیرم هر شوان بو کتی نیوت چیه کتی دایک و بابم نبوه به هتیوی ڤوره بوم پی‌یان کتوم قر کتی له کوی هاتوی کتی قربان هیند ڤراوم اصفهانیشم دیوه کتی برخانم لی نادزی کتی قربان دزی بمن نا‌کری کپنک و ڤوچنیان دایه تسلیم به شوانیان کرد روژیک له مری هتوه خـتون ڤلەزر بو خوی له بن پانکی دانا نانی بو داند سر به خو پی ڤت شاهزاده قره نانی بخو قر نـنی خوارد و هلستا برخی ور ڤیرا چو نشتی به بند به آوالشوانی ڤت

قر دلی ببم حالم بو له اصفهنی بو خوم میریتیم دکردوه دڤل بکلره
چندم له دیوانی رونیشتن میرزای زیدەنوس و سینەدفتره
چندم له بر دستی رالەوستان دەکری بگیرد و کمبره
چندم له دیوانی هبو پیاوی قابل مواجب بسره
روژی صد تورزین بدست پاتشای سجده بخیریان دینامه بره
دربند بمال دنیایه نهبوم عزیزم دمناردوه دره بدره
دچونه مواجب ورڤرتنی همو نوکر سر بسره
حدمات سندوسی همو به چنگ امن بو سرانسره
تا والله کس نبو دنگی بدا لبر پادشای قجره
ویستا بسر روت و به پی پی‌خاوس برخ حمد باشاغن له خرەخری بالینی دکم او بر او بره
چارم نیه ویستا دبی هتا ایواری ڤوچان بچقینم له پیش برخولان رابوستم دستوه نظره
کپنکی شواندنم دستوی دایه کلاوی چیارڤوبچکم لسره

# XIII.

## بیت قر و ثلەزر

وقتیکه شاه عباس لە اصفهانی راهات بو دمدمی هاتە سندوسی میوانی فرج‌اللەخنی اقی سندوسی بو فرج‌اللەخان زور حرمت ثرت شاه عباس لو سری کە ثراوه فرج‌اللەخنی دثل خوی بردە اصفهنی فرج‌اللەخان دوازدە کری بو کری لە هموان ثورتری قر بو قری دردە حاکم سندوسی خبریان بو قری هینە لتیان حمد باشاغان دچیک هیە نیوی خاتون ثلەزرە قتە جوان وا نیە قر قاصدیکی نارد بو لن خاتون ثلەزری قاصد چو صورت خاتون ثلەزری بو هینا بقری نشن دا قر لە سویان شیت و شیدا بو قر ناردیە کن بابی کتی بوم عرض شای بد بنوکر خوی قبولم بد عاشق بە دچ حمد بشغیان بوم جا کیف خویتی هلی‌ثرت لی نوسی او عیل ثرمینیە ری ناکوی امن بنیرمە کنی کچیم بدیە بو خوی بنیری خوازبینە بدا قر دغذیکی بو حمد بشغن نوسی حزی دلم ولاتی سندوسیش را بد ختونیکی هیە بمنی کرم بد حمد باشاغان بوی نوسیوه جا اوه چلون ریک دلوین او خلق لویستانی و امن خلق ثرمینی لچ من لە لویستانی بری ناچی و اویش نایینە ثرمینی قر کتی هل دستم بو خوم دچم اثر کیفم ثرتی دیموه لشکری دبم بزور لی دستینم اثر کیفم نی‌ثرت دیموه مالە خوم جا هلستا برثیک نوکرانە دبر کرد روی بو نیو عیل حمد بشاغان خاتون ثلەزر بسر ملی را

ومعاونت ولات وحکام ذوی الاحتشام در کمال امنیت وآسایش با فراغت خاطر در میان طوایف وعشایر اکراد و الوار توقف نموده وبرای امتثال امر امپراطوری وخدمت بعالم علوم تاریخ واشتقاق السنه (linguistique) خوش بختانه بانجام این خدمت مقدس موفق گردید چون مقصود این ماموریت حاصل نشده است مگر بتوجه اعلی حضرت شاهنشاه ممالک محروسهٔ ایران لهذا نتیجهٔ تحقیقات خودرا بشکل یک کتاب مدون بزیور طبع آراسته آن را بنام نامی آن پادشاه جم جاه مزین وموسوم به تحفهٔ مظفریه داشت از مطالعه کنندگان عظام مستدعیست که نواقص ومعایب این تالیف را بنظر عفو ملاحظه فرمایند

اوسکار مان

در شهر برلین در ماه نوبمبر سنهٔ ۱۹۰۵

# دیباچه

بر ارباب خرد ودانش واصحاب ذکا وبینش پوشیده نیست که عمدهٔ ترقیاتیکه در عالم علوم وادبیات حاصل شده از توجه وعنایت سلاطین وپادشاهان عظیم الشان بوده است علی هذا بدون معاونت ایشان ترقی کامل در علوم وتمدن ملل خالی از اشکال نیست چنانکه این بندهٔ درگاه آسمان جاه اوسکار مان که در سنهٔ ۱۹۰۱ تا ۱۹۰۳ بر حسب امر وارادهٔ بندگان اعلی حضرت امپراطور دولت ابدمدت آلمان برای تحقیق السنهٔ که در افواه طوایف مختلفهٔ ممالک محروسهٔ ایران هنوز معمول ومصطلح است وربط کامل بالسنهٔ قدیمه از قبیل فرس قدیم وپهلوی دارد که در ایام پیشدادیان وساسانیان زبان اهالی مملکت بود بولایات آن مملکت سفر کرده وپس از انجام ماموریت نتیجهٔ اطلاعات خودرا بعرض برساند ودر تمام این مدت دو سال ونیم مسافرت در ظل عنایت بندگان اعلی حضرت مظفرالدین شاه قاجار شاهنشاه ممالک محروسهٔ ایران خلد الله ملکه وسلطانه وهمراهی

# دیباچه

بر ارباب خرد ودانش واصحاب ذکا وبینش پوشیده نیست که عمدهٔ ترقیاتیکه در عالم علوم وادبیات حاصل شده از توجه وحمایت سلاطین وپادشاهان عظیم الشان بوده است علی هذا بدون معاونت ایشان ترقی کامل در علوم وتمدن ملل خالی از اشکال نیست چنانکه این بندهٔ درگاه آسمان جاه اوسکار مان که در سنهٔ ۱۹۰۱ تا ۱۹۰۳ بر حسب امر وارادهٔ بندگان اعلی حضرت امپراطور دولت ابدمدت آلمان برای تحقیق السنهٔ که در افواه طوایف مختلفهٔ ممالک محروسهٔ ایران هنوز معمول و مصطلحست وربط کامل بالسنهٔ قدیمه از قبیل فرس قدیم وپهلوی دارد که در ایام پیشدادیان وساسانیان زبان اهالی مملکت بود بولایات آن مملکت سفر کرده وپس از انجام ماموریت نتیجهٔ اطلاعات خودرا بعرض برساند ودر تمام این مدت دو سال ونیم مسافرت در ظل حمایت بندگان اعلی حضرت مظفر الدین شاه قاجار شاهنشاه ممالک محروسهٔ ایران خلد الله ملکه وسلطانه وهمراهی

# تحفهٔ مظفریه

در

# زبان کردی مکری

از تصنیفات

بندهٔ درگاه اوسکار مان

پروفسور وحافظ کتبخانهٔ پادشاهی

درمطبعهٔ گیورگ رایمر در شهر برلین

بزیور طبع آراسته گردید

سنه ۱۹۰۵